# ڕێنووسی کوردی

# بەدوو ئەلف و بێی لاتینی و ئارەبی

مستەفا ئێلخانی زادە

Rênûsî kurdî

Be dû Elfûbêy latînî w Arebî

Mistefa Êlxanî Zade

**بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە**
**بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر**

ناوی کتێب: ڕێنووسی کوردی بەدوو ئەلف و بێی لاتینی و ئارەبی
نووسینی: مستەفا ئیلخانی زادە
پیتچنین: فێرگەی زمانی کوردی و ئەدەبیاتی منداڵانی ئەدەب
نەخشەسازی ناوەڕۆک: نەورۆز جەمال
تابلۆی بەرگ: هونەرمەند کاکەیی
نەخشەسازی بەرگ: ئامانج ئەمین
چاپ: بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری - هەولێر/ ٢٠١٢

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٨٠٨) ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

# پێشەکی

ئەم کتێبە ڕێنووسـی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینییە: کە بەشـێوەیەکی زۆر سادەو لە هەمان کاتدا زانستی، نووسراوەو بە هاسانی خوێنەر فێری خوێندن و نووسینی کوردی بەم ئەلفوبێیە دەکات.
دەکـرێ لـە فێرگەکانـی زمانـی کـوردی وەک کتێبێکـی فێـرکاری بگوترێتەوەو خوێنەر بۆ خۆشـی دەتوانێ لێی فێربێ. ئێمە لێرەدا بۆ هاسـانکاری وانەو دەقەکانمان بە هەردوو ئالفابێتی لاتینی و ئارەبی نووسیوە. وامان پێ باش بوو لەم کتێبەدا بێجگە لە فێرکاریی کوردی بە ئەلفوبێی لاتین ژیانانامەی چەن شـاعیرو نووسـەرو چەن پارچە شیعریش بگونجێنین، تاخوێنەر چێژو سوودێکی زیاتری لێوەرگرێ.
لەکۆتاییدا ، سوپاسـی بەڕێزان کاک شـاکر ئەبووبەکرو کاک ماجید نووری ،کە ئەرکیان بووە لە چاپی ئەم کتێبە دا؛دەکەم.

مستەفا ئێلخانی زادە

# Pêşekî

Em ktêbe r̂ênûsî kurdî،be Elfubêy latîniye: ke be şêweyekî zor sade w le heman katda zanstî، nûsrawe w be hasanî xuêner fêr̂î xuêndin u nûsînî kurdî bem elfubêye dekat.
Dekrê le fêrgekanî zimanî kurdî wek kitebêkî fêrkar̂î bigutrêtewe w xuêner bo xoşî detwanê lêy fêrbê.
Ême lêreda bo hasankar̂î wane w deqekaniman be herdû alfabêtî latînî w arebî nûsîwe. Waman pê baş bû lem kitêbeda bêcge le fêrkar̂îy kurdî be elfubêy latînî jiyannamey çen şa'îr u nûser u çen parçe şî'rîş biguncênîn ta xuêner çêj u sûdêkî ziyatirî lêwergirê.
supasî ber̂zan kak şakir ebûbekr u kak macî d nurî ke erkiyan bûwe le çapî em kitêbeda;dekem..

Mistefa Êlixanî Zade

# ئەلفوبێی کوردی بەلاتینی

بــە گوێرەی بــەراوردی جووتۆکەکان (جفت واژەها) شــێوە زمانی کرمانجیی نیوەڕاســت (٣٥) فۆنیمی هەیە. زۆر وشەی عەرەبیش کە دەنگی (ع)ی تێدایە لە زمانی کوردی ئەوڕۆماندا بەکاردەهێنرین ،وەک: عەبدوڵلا، عەلی، عومەر، عیساو لەعنەت وعالەم و هتد... دەکرێ (ع)یش بە فۆنیمێکی زمانی کوردی بژمێردرێ. بەو شێوەیە ژمارەی فۆنیمەکانی زمانی کوردی (شێوەی کرمانجیی نێوەڕاست) دەبێتە (٣٦) فۆنیم (واج).
هەمزە پیتێکە سیســتەمی ئەلفوبێی عەڕەبی بەســەرزمانی کوردیدا سەپاندووەو فۆنیمێکی یاریدەدەرەو هەمیشە لەپێش پیتە دەنگدارەکان لە ســەرەتای وشــە کوردییەکانــدا دێ. وەک ئاو، ئەنــدازە، ئەختەر، فۆنیمێکی سەربەخۆ نییەو هیچ هێماو پیتی بۆ دانەندراوە. لە ئەلفوبێی لاتینــی بــۆ فۆنیمەکانی (ح)و (ڕ)و (ڵ) پیت دانەندراوە ئێمە وامان پێ باشــە بــۆ ئەم پیتانە هێمــای (تایبەتی) بۆ دابندرێ.بــۆ (( ح، ĥ)، بۆ( ڕ، r̂)، بــۆ( ڵ، l̂)) بــۆ ئــەوەی لــە پیتــی (ه)و (ر)و(ل) جیابکرێنەوە.

# Elfubêy kurdî be latînî

Be guêrey berawirdî cûtokekan (cuftwajeha) şêwe zimanî kirmancî neweȓast (35) fonîmî heye. zor wişey erebîş ke dengî (')î têdaye le zimanî kurdî ew ȓomanda bekar dehênrên ،wek:'ebidulla، 'elî، 'umer، 'îsaw le'netu 'alem u htd. dekirê (')îş be fonîmêkî zimanî kurdî bijmêrdirê. bew şêweye jmarey fonîmekanî zimanî kurdî (şêwey kirmancî uwarû) debête (36) fonîm (wac) hemze pîtêke sîstemî elfubêy 'erebî beserzimanî kurdîda sepanduwew fonîmêkî yarîdedere hemîşe lepêş pîte dengdarekan le seretay wişe kurdiyekanda dê. wek aw، endaze، exter، fonîmêkî serbexo niyew hîç hêmaw pîtî bo danendirawe. le elfubey latînî bo fonîmekanî (ĥ)u (ȓ)u (ȋ) pît danendirawe ême waman pê başe bo em pîtane hêmay (taybetî) bo dabindrê bo ح( ĥ)bo ڕ( ȓ) boل ( ȋ)) bo ewey le pîtî (hه) (rر) (lل) ciyabikrênewe.

## پیتەکانی کوردی بەئەلفوبێی عەرەبی ولاتینی نشانە ها و آواها

| فارسی | LATINÎ لاتینی | کوردی |
|---|---|---|
| ـــَـــ | e E | ئە |
| آ | aA | ئا - ا |
| ـــــ | Ê | ئێ |
| ای | Î | ئی(ی بزوین) |
| ـــــ | oO | ئۆ |
| او | û û | ئوو |
| ب | bB | ب |
| پ | pP | پ |
| ت | tT | ت |
| ج | cC | ج |
| چ | ç ç | چ |
| ح | ĥĤ | ح |
| خ | x X | خ |
| د | dD | د |
| ر | R̂-r̂-R-r | ڕ-ر |
| ز | zZ | ز |
| ژ | jJ | ژ |

| | | |
|---|---|---|
| س ث ص | sS | س |
| ش | Ş ş | ش |
| ع | (’) | ع |
| غ | x̂ X̂ | غ |
| و | wW | و(دەنگ) |
| و | Uu | و(بزوێن) |
| ف | Ff | ف |
| ق | qQ | ق |
| ڤ | Vv | ڤ |
| ک | kK | ک |
| گ | gG | گ |
| ل | L L̂ | ل - ڵ |
| م | mM | م |
| ن | nN | ن |
| ه | hH | ه |
| ی | Yy | ی(دەنگ) |
| ----- | i | کورتە بزوێن |

لەم (٣٦) پیتانەدا ئەم پیتانەی خوارەوە بزوێنن( Vowels)

- بزوێن -و بزوێن - ی بزوێن - کورتە بزوێن- ێ - ە - ا / a e ê i î u û o

وو - ۆ

واوی کــراوه ( ۆ O)،واوی درێــژ (وو û )واوی کــورت(و u) یێــی دەنگدار (î ی)، یێ(ê ێ)،ئه ه(e)،ئەلف(ا a )،بزرۆکه(- i).

lem (٣٦) pîteda em pîtaney xuarewe bizwênin (vowels)

او وو ه ۆ ی ێ / aeê i î u û o
wawî kirawe ( o),wawî drêj (û )wawî kurt(u) êy dengdar (î), ê,e,elf(a),bizroke(-i).
بیســت وهەشــتەکەیتر بێدەنگــن (CONSONANTS) هەمــزەش لەئەلفوبێی لاتینی پیتی بۆدانەنراوه.
دەبێ بزانین هەر وشەیەک لە چەند برگە ساز دەبێ وهەر برگەیەکیش لە پیتێکی دەنگدار (بزوێن) وچەند پیتی بێدەنگ (دەنگی کپ) پێکدێ.
بۆ وێنه :
وشەی( کوڕ KUȒ– ) تەنیا یەک برگەیە و لەدووپیتی بێدەنگیK ک- Ȓ ڕ وپیتی واوی کورتی دەنگدار( و U) سازبووه .
وشــەی بۆکان BOKAN لەدوو برگــه پێکهاتووه، برگەی یەکەم (لەپیتی نەبزوێنی( ب B)وپیتــی بزوێنی(ۆ O) )برگەی دووەم(لەپیتی نەبزوێنی (کK) و(نN) وپیتی بزوێنی (A)).
دووپیتی دەنگدار(بزوێن) هیچ کات بەدوای یەکدا نایەن .

Bîst u heştekeytir bêdenign ( CONSONANTS) hemzeş le elfubêy latînî pîtî bodanenrawe.

Debê bizanîn her wişeyek le çend biȓge saz debê her biȓgeyekîş le pîtêkî dengdar (bizwên) u çend pîtî bêdeng (dengdarî kip) pêkdê.

bo wêne :

Wişey( kuȓ) tenya yek biȓgeye w ledû pîtî bêdengî K k-Ȓ ȓ w pîtî wawî kurtî dengdar(U u) sazbûwe .

Wişey bokan ledû biȓge pêkhatuwe، biȓgey yekem lepîtî nebzwênî(B b) w pîtî bizwênî(Oo) biȓgey dûhem(lepîtî nebizwênî (Kk) u (Nn) u pîtî bizwênî (Aa)).

Dû pîtî dengdar(bizwên) hîç kat beduay yekda nayen .

# (ئا ا)


ئارد ard


ئاو aw


ئاش aş

ئاش- ئارد- ئاو- ئاشەوان

ئالآ- ئاشی ئاو

ئەوئاشە بە ئاو دەگەڕێ

لە دێی ئێمەدا دوو ئاشی ئاو هەیە

خەڵکی دەغڵ و دانی خۆیان لەو دوو ئاشە لێ دەکەن

ئاشی نەزان خودا دەیگێڕێ.

# (a)



ard ئارد



ئاو aw



aş ئاش

aş- ard- aw- aşewan

aĺa- aşî aw

ew aşe be aw degeȓê

le dêy êmeda dû aşî aw heye

xeĺkî dex̂Î u danî xoyan lew dû aşe lê deken

aşî nezan xuda deygêȓê.

# ( ب )


ba با


bazaȓ بازاڕ


baweşên باوەشێن

با- باران- باوەشێن

باران- بار

بان- بازاڕ

بانان دڵۆپەیان کرد.

با هات، بوو بە بۆران.

بابە چوو بۆ بازاڕ.

باری خوار ناگاتە مەنزڵ.

# (b)


baweşên باوەشێن


bazaȓ بازاڕ


ba با

ba- baran- baweşên

baran- bar

ban- bazaȓ

banan diȴopeyan kird.

ba hat، bû be boran.

babe çû bo bazaȓ.

barî xuar nagate menziȴ.

# (پ)



pez پەز



piyaw پیاو



penîr پەنیر

پەز- پاوانە- پەمۆ- پاڵە

پارشێو- پووش- پەنیر- پرچ

بێری مەڕ دەدۆشێ.

شیر بە شیر پاڵێودا دەکەن.

پەنیر لە شیر دەگرن.

پارووی گەورە پیاو دەخنکێنێ.

# (p)



پەز pez



پیاو piyaw



penîr پەنیر

pez- pawane- pemo- paîe

parşêw- pûş- penîr- pirç

bêrî meî dedoşê.

şîr be şîr paîêwda deken.

penîr le şîr degrin.

parûy gewre piyaw dexinkênê.

# ( ت )



تەون tewin



توورەکە tûreke



تەماتە temate

تەون- تەشی- تەشی ڕێس- توورەکە

تەڕ- تارا- tووران- تەمەن

تاراو tووران خوشکن.

تارا لە tووران بە تەمەنترە.

تارا تەشی دەڕێسێ.

tووران درووێنان دەکا.

تاراو tووران بەیەکەوە کار دەکەن.

تانەکەوی نابێ بە سوار.

# (t)


tewin تەون


tûreke توورەکە


temate تەماتە

tewin- teşî- teşî řês- tûreke

teř- tara- tûran- temen

tara w tûran xuşkin.

tara le tûran be tementire.

tara teşî deřêsê.

tûran dirûman deka.

taraw tûran beyekewe kar deken.

ta nekewî nabî be swar.

# (ج)



جەژن cejn



جووت cût



جەنجەڕ cencer̂

جووتیار- جۆگە- جەنجەڕ- جۆخین

جۆ- جەڕە- جاجم- جیران

جووتیار جووت دەکا.

جووتیار جۆگە جۆماڵ دەکا.

ئەو گەنم و جۆ دەچێنێ.

جووتیار گەنم و جۆ ئاو دەدا.

جاوکەر بێ کفن دەمرێ.

# (C)





cejn جەژن    جووت cût    cenceȓ جەنجەڕ

cûtyar- coge- cenceȓ- coxîn

co- ceȓe- cacim- cîran

cûtyar cût deka.

cûtyar coge comaȋ deka.

ew genim u co deçenê.

cûtyar genim u co aw deda.

cawker bê kifin demrê.

# (چ)



چیا çiya



چێل çêl




چەک çek

چیا- چاندن- چەکو- چەک

چۆڵ- چاڵ-چێل

چەکو گاوانە

ئەو دەچێتە بەرگاڕان.

چەکو شوانی بزنانە.

ئەو بزنەکان دەباتە چۆمی ئاویان دەدا.

بزنەکان چرپی و چاڵ دەخۆن.

چەرمی گا، باری ئێسترە.

# (Ç)



çiya چیا



çêÎ چێل




çek چەک

çiya- çandin- çeko- çek

çoÎ- çaÎ- çêÎ

çeko gawane

ew deçête bergaȓan.

çeko şuanî biznane.

ew biznekan debate çomî awyan deda.

biznekan çrpîwçaÎ dexon.

çermî ga، barî êstire.

# (٥)


هەرمێ hermê


هەنجیر hencîr


هەڵاتن heĺatin

هەرمێ- هەنجیر- هەواڵ- هەڵاتن

هەوا- بەهار- هەنار- هاروێ

هەوای بەهارێ فێنکە.

هەرمێ و هەنجیر و هەنار میوەن.

هەرمێ و هەنجیر لە بەهاردا گوڵ دەردەکەن.

چ بە هارو چ زستان.

چ گەرمێن و چ کوێستان.

بۆ پیاوی دەستەوستان.

# (h)


hermê هەرمێ


hencîr هەنجیر


heÎatin هەڵاتن

hermê- hencîr- hewaÎ- heÎatin

hewa- behar- henar- harwê

heway beharê fênike.

hermê w hencîr u henar mîwen.

hermê w hencîr le beharda guÎ derdeken.

çi behar u çi zistan.

çi germên u çi kuêstan.

bo piyawî destewistan.

# (ح)





ĥîle حیله ĥewşe حەوشە حەوت ĥewt

حەوشە- حیلە- حەسەن

نێوی هاواڵەکەم حەسەنە.

حەسەن بەرخەکان لە حەوشە دەکا.

حەسەن و حامید بران.

حاڵی بوون لە مێوژو گوێز خواردن خۆشترە.

# (ĥ)







ĥewt حەوت ĥewşe حەوشە ĥîle حیلە

ĥewşe- ĥîle- ĥesen

nêwî hawaĵekem ĥesene.

ĥesen berxekan le ĥewşe deka.

ĥesen u ĥamîd biran.

ĥaĵî bûn le mêwj u guêz xuardin xoştire.

# (خ)



خوشک xuşk



خانوو xanû



خەو xew

خوشک- خوشناو- خانوو

خویندەوار- خویندن

خەزال- خاتوون

خەزاڵ و خاتوون خوشکن.

خوشناو برای خەزاڵ و خاتوونە.

خەزاڵ و خاتوون خویندەوارن.

خەبات خالی هەرسێکیانە.

خودا کێوان دەبینی بەفریان دەخاتێ.

# (X)



خوشک xuşk



خانوو xanû



خەو xew

xuşk- xoşnaw- xanû

xuêndewar- xuêndin

xezaî- xatûn

xezaî u xatûn xuşkin.

xoşnaw biray xezaî u xatûne.

xezaî u xatûn xuêndewarin.

xebat xaîî hersêkyane.

xuda kêwan debînê befriyan dexatê.

# (د)



dehoÎ دەهۆڵ



dar دار



didan ددان

دایک- دادە- دار- ددان

دەرزی- دەرمان- دانا

دایک دڵۆڤانە.

دادە مانگا دەدۆشێ.

دیمەن بە دەرزی درووومان دەکا.

دارو بەرد گوێدارە.

# (d)



didan ددان



dar دار



dehoÎ دەهۆل

dayk- dade- dar- didan

derzî- derman- dana

dayk diÎovane.

dade manga dedoşê.

dîmen be derzî dirûman deka.

dar u berd guêdare.



rêwî ڕێوی



rûbar ڕووبار



Rêga ڕێگا

ڕووبار- ڕێوی- ڕزگار- ڕاست

برین- باران- بار

((ڕێیەکانی دێڕی یەکەم ڕێی گەورەن کەلە کوتنی ئەو پیتەدا زمان زیاتر بەرەو مەلا شووی سەرەوە هەڵدەکشی هەتا ڕێی چکۆڵە)).

ئەوە ڕێوییە .ڕێوی فیڵبازە.

تاجی ڕێوی بریندار کرد.

ڕێوی بۆ خۆی لەکونەوە نەدەچوو، قانگەلاشکیشی لەگەڵ خۆی دەبرد.

# (R̂ r̂)


R̂êga ڕێگا


r̂ûbar ڕووبار


r̂êwî ڕێوی

r̂ûbar- r̂êwî- r̂izgar- r̂ast

birîn- baran- bar

((r̂êyekanî dêr̂î yekem r̂êy gewren ke le kutinî ew pîteda ziman ziyatir berew meÎaşûy serewe heÎ dekşê heta r̂êy çikoÎe)).

ewe r̂êwîye. r̂êwy fêÎbaze.

tacî r̂êwî birîndar kird.

r̂êwî bo xoy lekunewe nedeçû، qangelaşkîşî legeÎ xoy debird.

# (ز)





ziman زمان Zemawend زەماوەند zêř زێڕ

زمان- زانا- زێڕ

زمانزان- زانیار- زەماوەند

زێڕین زمانزانە.

ڕێبین برای زانیارە.

زانا کوڕێکی زمانزانە.

ئەگەر زۆر هات قەباڵە بەتاڵە.

# (Z)







زێڕ zêř Zemawend زەماوەند ziman زمان

ziman- zana- zêř

zimanzan- zanyar- zemawend

zêřîn zimanzane.

řêbîn biray zanyare.

zana kuřêkî zimanzane.

eger zor hat qebaîe betaîe.

# (ژ)



jan ژان



jûr ژوور



jin ژن

ژن- ژیان- ژەنگ

ژێرکراس- ژوور- ژان

ژن و مێرد پێکەوە دەژین.

ژن و مێرد هەردووک کاردەکەن.

ژن ژیرو کارلێهاتووە.

ژن و ماڵیان کوتووە.

# (j)



jin ژن



jûr ژوور



jan ژان

jin- jiyan- jeng

jêrkiras- jûr- jan

jin u mêrd pêkewe dejîn

jin u mêrd herdûk kardeken

jin jîr u karlêhatuwe

jin u maîyan kutuwe

# (س)



سوار suar



سەر ser



سارد sard

سەر- سارا- سارد- ساوار

سەردار- سەرۆک- سوار- سوێسن

سەردار برای ساراو سوێسنە.

سارا ساوار بە دەستاڕ دەهاڕێ.

سەعید سواری ئەسپ دەبێ.

سوعدا کچی مام بارامە.

سەری قووچە بنی پووچە.

# (S)



suar سوار



ser سەر



sard سارد

ser- sara- sard- sawar

serdar- serok- suar- swêsin

serdar biray saraw suêsine

sara sawar be destaf̂ dehaf̂ê

se'îd suarî esp debê

su'da kiçî mam barame

serî qûçe binî pûçe.

# (ش)



شیر şîr



شۆرباو şorbaw



شوان şuan

شەو- شیرین- شار- شۆرباو

شیر- شووشە- شوێن- شێلاقە

ئەوشۆ شۆرباو لێدەنێین.

شەوبۆ کچی شەماڵە.

شەماڵ شیرفرۆشە.

شیردەبا بۆ شار دەیفرۆشی.

شەماڵ دوێنێ لە شار گەڕاوە.

شیر کالانی خۆی نابڕی.

# (Ş)



شیر şîr



şorbaw شۆرباو



şuan شوان

şew- şîrîn- şar- şorbaw

şîr- şûşe- şuên- şêlaqe

ewşo şorbaw lêdenêyn.

şewbo kiçî şemaÎe.

şemaî şîrfiroşe.

şîr deba bo şar deyfiroşê.

şemaî duênê le şar geȓawe.

şîr kalanî xoy nabiȓê.

# (ع)



عەلی 'êli



عوود 'ûd



عاسمان 'asman

بۆ نیشاندانی پیتی عەین (ع) لە هێمای (**'**) کەڵک وەردەگیرێ

ع- عا- عو- عۆ- عوو

عنیشک- عەلی- عیسا- عاسمان

عێلات- عۆدە- عوود- عوسمان

عەولا کوڕی عوسمانە.

عەلی زۆر عادڵە.

عەزیز عوود لێدەدا.

عەرز نێزیک، عاسمان دوور.

# ( (’) ’eyn)



’asman عاسمان



’ûd عوود



’êli عەلی

bo nîşandanî pîtî ’eyn (’) le hêmay (’) keîk werdegîrê

’e- ’a- ’u- ’o- ’û

’nîşk- ’elî- ’îsa- ’asman

’êlat- ’ode- ’ûd- ’usman

’ewÎa kuřî ’usmane.

’elî zor ’adiÎe.

’ezîz ’ûd lêdeda.

’erz nêzîk، ’asman dûr.

# (غ)



غاردان xardan



باغ bax̂



ولاغ Wiĺax̂

غار- غاردان- باغ

کاوه به غاردان هات

کوتی چووبووم بۆ غاری سەهۆڵان

غاری سەهۆڵان لە نزیک دێی سەهۆڵان سەر بە شاری مەهابادە.

ئەو غارەغارێکی زۆر لە مێژینەیە.

لەنێو ئەو غارەدا گۆلاوێکی زۆر گەورە هەیە.

بـەردی ڕەنگاوڕەنگی زۆر جوانی تێدایـە، ڕۆژانی هەینی و وچان،

غەوارەیەکی زۆر بۆ دیتنی ئەو غارەدێن.

مام بارام زۆر دەوڵەمەندە. زەوی و زارو باغی زۆری هەیە، بەداخەوە

وەجاغ کوێرە.

هەرکەس ئارەزووی ماڵانی هەبێ

وەجاغی کوێر بێ و ئەولادی نەبێ

# ( X̂ )



ولاغ Wil̂ax̂



غاردان x̂ardan



bax̂ باغ

x̂ar- x̂ardan- bax̂

kawe be x̂ardan hat

kutî çûbûm bo x̂arî sehoÎan

x̂arî sehoÎan le nizîk dêy sehoÎn ser be şarî mehabade.

ew x̂are x̂arêkî zor le mêjîneye.

le nêw ew x̂areda golawêkî zor gewre heye.

berdî r̂engawr̂engî zor cuwanî têdaye.

r̂ojanî heynî w wiçan x̂ewareyekî zor bo dîtinî ew x̂are dên.

mam baram zor dewÎemende.

Zewî w zar û bax̂î zorî heye. bedaxewe wecax̂ kuêre.

herkes arezûy maÎanî hebê

wecax̂î kuêr bê w ewladî nebê

# ( ڤ )



فیل fîl



بەفر befir



فرمێسک firmêsk

فرۆ- فیتوو- فەریک- فەنەر

فرۆ لەشیری ئاژەڵی تازەزاو دروست دەبێ.

بۆ فراوین فرۆ خۆشە.

فەرهاد فەرمانبەری میرییە.

بە باو بە باران لە عومری بەفر کەم دەبێتەوە.







fîl فیل   befir بەفر   firmêsk فرمێسک

firo- fîtû- ferîk- fener

firo le şîrî ajel̂î tazezaw dirust debê.

bo firawîn firo xoşe.

ferhad fermanberî mîrîye.

be baw be baran le 'umrî befir kem debêtewe.


قاز qaz


قەپاغ qepax̂


قەلات qeÎat

قاز- قەلەڕەشە- قەلەو

قورم- قورقڕۆچکە- قولاپە

قازو قورینگ باڵندەن.

**قاز باڵندەیەکی** قەلەوە.

قاسم لە جیژنی قورباندا لە دایک بووە.

قارەمان گۆشتی قاژووی پێخۆشە.

قەدری زێڕ لەلای زێڕینگەرە.

# (q)


قاز qaz


قەپاغ qepax̂


قەلات qel̂at

qaz- qeleȓeşe- qel̂ew

quɍm- quȓqiȓoçke- qulape

qazu qurîng bal̂inden.

qaz bal̂indeyekî qel̂ewe.

qasim **le cêjnî** qurbanda le dayk bûwe.

**qareman goştî** qajûy pêxoşe.

**qedrî zêȓ lelay** zêȓîngere.



kiras کراس



ker کەر



kew کەو

کار- کۆچەر- کراس- کاوە

کەسک- کەلەم- کەو- کوێستان

کاوەو کابان کۆچەرن.

کۆچەر گەرمێن و کوێستان دەکەن.

کاکل چوو بۆ کاشان.

کابان پەنیر لە کووپە داخنێ.

گەنم بە کێلە دەپێون.

کەرچووە بەغدا بووە ئێستر.







کەو kew کەر ker کراس kiras

kar- koçer- kiras- kawe

kesk- kelem- kew- kuêstan

kawew kaban koçerin.

koçer germên u kuêstan deken.

kakil çû bo kaşan.

kaban penîr le kûpe daxinê.

genim be kîle depêwin.

ker çuwe be x̂da bûwe êstir.

## تێبینی:

لــە هێندێک زاراوەو ناوچەی کوردســتان ئەگەر (کــ) لەپێش یەکێک لــە پیتەکانــی (ی- ێ- وێ)دا بێ دەنگێکــی تایبەت لە نێوان (کـ و چ) دەگــرێ. بەو کافە دەگوترێ کافی کلۆر چونکە ئەو کافە لەگەڵ کافی دیکــە (پڕ) جووتۆکەی بەواتا جیاوازا ســاز نــاکا کەوا بوو ئەم دوو کافە سەر بە یەک فۆنیمن و نابێ پیت یان هیچ هێمایەکی جیاوازیان بۆ دابندرێ. ئەو چەند وشەتان بۆ وێنە بۆ دێنمەوە:

کیلە- کێو- کوێستان

têbînî:

le hêndêk zarawew nawçey kurdistan eger (k) lepêş yekêk le pîtekanî (î- ê- uê)da bê dengêkî taybet le nêwan (k u ç) degrê. bew kafe degutrê kafî kilor çunke ew kafe legeî kafî dîke (piř) cûtokey bewata ciyawaz saz naka kewa bû em dû kafe ser be yek fonîmnu nabê pît yan hîç hêmayekî ciyawazyan bo dabindrê. ew çend wişetan bo wêne bo dênmewe:

kîle- kêw- kuêstan

# گ

گوڵ- گۆلاو

گوێلک- گوێلکەوان

گیا- گۆشت- گۆڤەند

گیسک- گێرە- گوێز- هەنگوین

گوندی ئێمە گەورەیە.

گوندی ئێمە دار گوێزی زۆرە.

مێشەنگوین هەنگوین دروست دەکا.

گێلاس میوەیەکی خۆشە.

گورگ بۆتە گاوان.

گوڵ guĺ





گۆشت goşt

## تێبینی:

ئـەو گافانەی لەپێـش یەکێک لە پیتەکانــی (ی- ێ-وێ- وی)دا دێن دەنگێکـی تایبەتیان لــە بەینی (گ و چ)دا هەیــە. ئەوانیش وەک کافی کلـۆر فۆنیم نین و نابــێ پیت، یان هێمایان بۆ دانــدرێ لێرەدا چەند وشەی کە دەنگیان دەگۆڕدرێت بۆ وێنە دەهێنینەوە :

گیسک- گێل- گوێز- نینگوین.

# g

گول guî



guî- goîaw
guêlik- guêlkewan
giya- goşt- govend
gîsk- gêre- guêz- henguîn
gundî ême gewreye.
gundî ême dar guêzî zore.
mêşenguîn henguîn dirust deka.
gêlas mîweyekî xoşe.
gurg bote gawan.



گوشت goşt

**têbînî:**

ew gafaney lepêş yekêk le pîtekanî (î- ê- uê- uî) da dên dengêkî taybetyan le beynî (g u ç)da heye. ewanîş wek kafî kilor fonîm nînu nabê pît، yan hêmayan bo dandrê lêreda çend wişey ke dengyan degoȓdrêt bo wêne dehênînewe :

gîsk- gêl- guêz- nênguîn.

# (ل ڵ)





kiĺaş کلاش lanik لانک milwanke ملوانکه

لاو- لانک- ملوانکه- بلوێر

کاڵەک- خۆل- خاڵ-کڵاش

هیدایەت لاوێکی ژیرە.

وشتر ملی درێژە.

هێرۆ ملوانکەی هەیە.

بارام بلوێر لێدەدا.

چنوور کاڵەک دەخوا.

# (L L̂)



milwanke ملوانکە



lanik لانک



kiL̂aş کلاش

law-lanik-milwanke-bilwêr

kaL̂ek-xoL̂-xaL̂-kiL̂aş

hîdayet lawêkî jîre.

wiştir milî dirêje.

hêro milwankey heye.

baram bilwêr lê deda.

çinur kaL̂ek dexua.





مار mar مامز mamiz mêrûle مێروولە

مار- ماسی- بەرماڵ- مێروولە

مزگەوت- ماسیگر- میراو- میوان

ئەو پیاوە ماسیگرە.

ماسی لە ئاودا دەژی.

ماڵی وان لەسەر چۆمی ئارازە.

مام مووسا خەڵکی دێی میراوییە.

مار بە قسەی خۆش لە کون دێتەدەر.







میرووله mêrûle مامز mamiz مار mar

mar- masî- bermaÎ- mêrûle

mizgewt- masîgir- mîraw- mîwan

ew piyawe masîgire.

masî le awda dejî.

maÎî wan leser çomî araze.

mam mûsa xeÎkî dêy mîrawêye.

mar be qisey xoş le kun dêteder.

# ن



نەخشە Nexşe



نانکەر nanker

نان- نانکەر- نانەوا- ناودار

نێچیرڤان- نیو- نێوک- نوێن

ئەو پیاوە نێوی نادرە.

نادر برای نەرمینە.

نازدار کچی نێونجی نارنییە.

نۆک چووە بازاڕ بوو بە لەبلەبی.

# n



نەخشە Nexşe



نانکەر nanker

nan- nanker- nanewa- nawdar

nêçîrvan- nêw- nêwik- nuên

ew piyawe nêwî nadire.

nadir biray nermîne.

nazdar kiçî nêwincî narêye.

nok çûwe bazar̂ bû be leblebî.




گۆڤار govar



تاڤگە tavge

گۆڤار- ڤینگە -گڤە- بڤە- نێچیرڤان

نێچیرڤان گۆڤاری منداڵان دەخوێنێتەوە.

با گڤەی دێ.

تاڤگەی شەڵماش زۆر بەرزە.

دایکی ئاڤان پێی گوت:

ئاڤان دەس لە کوورە مەدە بڤە دەبی.

هەڤاڵ ئەسپی هەیە.

ئەو بە ئەسپ غار غارێن دەکا.

شوان و دلۆڤان سەیری هەڤاڵ دەکەن.

نێچیرڤان گۆڤاری منداڵانی بۆ هەواڵ هێناوە.




گوڤار govar



تاڤگه tavge

govar- vînge- give- bive- nêçîrvan

nêçîrvan govarî mindaÎn dexwênêtewe.

ba gvey dê.

tavgey şeÎmaş zor berze.

daykî avan pêy kut:

avan des le kûre mede bive debî.

hevaÎ espî heye.

ew be esp x̂ar x̂arên deka.

şuan u diÎovan seyrî hevaÎ deken.

nêçîrvan govarî mindaÎanî bo hewaÎ hênawe.

# و (بێدەنگ)



wirya ‌‌ وریا



wiştir ‌‌ وشتر

ورد- وردەواڵە- وریا

وریا کوڕێکی زۆر وردبینە.

شەوانە زوو دەخەوێ.

جووتێک کەوشی قاوەیی کڕیوە.

شەو و ڕۆژ هەدا نادا.

ڕاوچییەکی باشە.

کەو و کۆتر دەگرێ.

وشترو گێرە!

# w (bêdeng)



وشتر wiştir



وریا wirya

wird- wirdewaîe- wirya

wirya kuȓêkî zor wirdbîne.

şewane zû dexewê.

cûtêk kewşî qaweyî kiȓîwe.

şew û ȓoj heda nada.

ȓawçiyekî başe.

kew u kotir degrê.

wiştir u gêre!

## تێبینی:

واوەکانی پیتی یەکەم ،سێیەم و سێهەم بەولاوەی بڕگە واوی بێدەنگن (کۆنسۆنانت) وەک:

وشتر- ورد- کەو- خەو- پتەو- ئەو

لەنووسینی کوردی بە ئالفا بێتی لاتین هێمای (W) یان بۆ داناوە.

## Têbînî:

wawekanî pîtî yekem u sêyem u sêhem bewlawey biȓge wawî bêdengin (konsonant) wek:

Wiştir- wird- kew- xew- pitew- ew

lenûsînî kurdî be alfa bêtî latîn hêmay (w) yan bo danawe.




yek یەک Diyarî دیاری yarî یاری

یەک- یاری- یەواش

یەکیەتی و یەکبوون گەل سەردەخا.

وەرزێڕ بەیانان زوو دەچنە مەزرا.

شیرین کەیبانووی چاکە.

منداڵ کایەی پێخۆشە.

قسە هەزارە یەکیان بەکارە.

پیتەکانی یەکەم و سێیەم و سێهەم بەولاوەی بڕگە پێی بێدەنگن (کۆنسۆنانت) بە هێمای (y) نیشان دەدرێن.





یاری yarî ، دیاری Diyarî ، یەک yek

yek- yarî- yewaş

yekyetî w yekbûn gel serdexa.

werzêr̂ beyanan zû deçne mezra.

şîrîn keybanûy çake.

mindaî kayey pêxoşe.

qise hezare yekyan bekare.

yêyekanî yekemu sêyemu sêhem bewlawey bir̂gey bêdengin (konsonant) be hêmay (y) nîşan dedrên.

# هـ (ه)







hermê هەرمێ Henar هەنار

ئەمن- ئەو- هەیوان- ئەندازە

ئەمن هەرمێم پێخۆشە.

بەهێش میوەیەکی خۆشە.

دوێنێ دەستم بریندار بوو دەرمانم کرد.

ئەوەی لەسەر سەبرانە لەسەر خێرانە.



هەنار Henar



هەرمێ hermê

emin- ew- heywan- endaze

emin hermêm pêxoşe.

behêş mîweyekî xoşe.

duênê destim birîndar bû dermanim kird.

ewey leser sebrane leser xêrane.



mêş میش



dê دێ

مێش - دێ- ئێواره- شێو

دوێنێ ئێواره چوومه ناوشار زۆرم ئیشتیا له سێو بوو.

سێ کیلۆ سێوم کڕی لەگەڵ هێندێک گوێز.

پێشینیان کوتوویانه:

دار هۆرەی له خۆی نەبێ ناقەڵشێ.



دی dê



میش mêş

mêş - dê - êware- şêw

duênê êware çûme nawşar zorim îştiya le sêw bû.

sê kîlo sêwim kiȓî legeĺ hêndêk guêz.

pêşîniyan kutuyane:

dar horey le xoy nebê naqeĺşê.

# (ی) دەنگدار (بزوێن)







Hengwîn هەنگوین Hencîr هەنجیر penîr پەنیر

شیر- پەنیر- هەویر- نێچیر

ئاوەدانی- هەورامانی- کاری چاک

حەسەن کوڕی ڕەحمانە.

کاوە سەوزیی پێخۆشە.

دەبێ بۆ ئاوەدانیی وڵات تێبکۆشین.

بانەیی ئازان.

پیرۆت خەڵکی ئاوایی سەرایە.

# (î) dengdar (bizwên)


پەنیر penîr


هەنجیر Hencîr


هەنگوین Hengwîn

şîr- penîr- hewîr- nêçîr

awedanî- hewramanî- karî çak

ĥesen kuȓî ȓeĥmane.

kawe sewzîy pêxoşe.

debê bo awedanîy wiĺat têbikoşîn.

baneyî azan.

pîrot xeĺkî awayî seraye.

## تێبینی:

١-چونکــە پیتی (أ)مان بــۆ بزرۆکە داناوەو پیتی دیکــە لە ئەلفوبێی لاتینی بۆ نیشــان دانی پیتی بێی دەنگدار نییە ناچار بۆ نیشــان دانی پیتی بێی دەنگدار هێمای ( ^ ) لەسەر(أ) دادەنێین ئاوا
(أ̂ ).

٢- ئەوێنیەی لە جێی کەسرەی فارسییە (کورد لە کوردیدا کەسرەی فارسی وا دەخوێننەوە) بڕێک کورتترە وەک: ئاوری بن کایە- کوڕی چاک- ئەوانی تر کە لە جێی بێی دەنگداری فارســین بڕێک درێژترن وەک: شیر- سەوزی، لەوشەی سەوزیدا درێژ بوونەوەی دەنگی بێ بەهۆی هێزێکە (اســترس)کە کەوتۆتە بڕگەی دووهەمی ئەو وشەیە و پیتی (ی) لە کوردی و فارســیدا ئەگەر (ی)یەک کە هێزی لەسەرە بکەوێتە دوای پیتی دەنگدار (بزوێن) ئەوە هێزەکە دەبێتە (ی)کی تر، وەک:
ئاوایی- بانەیی- ئەهوورایی.

## Têbînî:

1- çunke pîtî (i)man bo bizroke danawew pîtî dîke le elfubêy latînî bo nîşan danî pîtî yêy dengdar niye

naçar bo nîşan danî pîtî yêy dengdar hêmay (^ ) leser(i ) dadenêyn awa (î ).

2- ew yêyey le cêy kesrey farsiye (kurd le kurdîda kesrey farsî wa dexwêninewe) biřêk kurttire wek:

awirî bin kaye- kuřî çak-

ewanî tir ke le cêy êy dengdarî farsîn biřêk dirêjtirin wek:

şîr- sewzî. le wişey sewzîda drêj bûnewey dengî

î be hoy hêzêke (êstrês)ke kewtote biřgey dûhemî ew wişeye w pîtî (î) le kurdî w farsîda eger (î)iyek ke hêzî lesere bikewête duay pîtî dengdar (bizwên) ewe hêzeke debête (î)kî tir. wek:

awayî- baneyî- ehûrayî.

# کورتە بزوێن ( i ) (بزرۆکە)



Jin ژن



Kil کل



Diİ دڵ

بزرۆکە (کورتەبزوێن) دەنگێکە لە نێوان ساکین و کەسرە ( i )دا

وەک ئەو وشانەی خوارەوە:

بڕ- شڕ- بنکڕ- کردن

لە وڵاتی پژدەر کارم دەکرد.

کار کردن زۆر باشە.

ئەمن بنکڕم پێخۆشە.

بڕێکم بدەیە برسیمە پێم خۆشە.

مست لەبەر شووژن خۆ ڕاناگرێ.

# Kurte bizwên (bizroke) ( i)





دل Diî کل Kil ژن Jin

bizroke (kurtebizwên) dengêke le nêwan sakîn u

kesre ( i )da

wek ew wişaney xuarewe:

bir̂- şir̂- binkir̂- kirdin

le wiîatî pijder karim dekird.

kar kirdin zor başe.

emin binkir̂im pêxoşe.

bir̂êkim bideye birsîme pêmxoşe.

mist leber şûjin xo r̂anagrê.



Kurd کورد



Gul̂ گوڵ



Kur̂ کوڕ

کورد- دوژمن- قوڕ- دوڕ

کورد نەتەوەیەکی لەمێژینەیە.

بارام و کوڕەکەی چوون بۆ خوراسان.

ئەو چەقۆیە زۆر کولە.

کوڕ کوڕ بێ ماڵی بابی ناوێ.

ئەو واوە کورتانەی پیتی دووهەمی بڕگەن واوی دەنگدار (ڤاوڵ)ن
به (U) نیشان دەدرێن. وەک:
کوڕ- بولبول- دوژمن

u g



Kurd کورد



Gul̂ گوڵ



Kur̂ کوڕ

kurd- dujmin- qur̂- dur̂

kurd neteweyekî lemêjîneye.

baram u kur̂ekey çûn bo xurasan.

ew çeqoye zor kule.

kur̂ kur̂ bê mal̂î babî nawê.

## têbînî:

ew wawe kurtaney pîtî dûhemî bir̂gen wawî dengdar (vawlin) be (u) nîşan dedrên. wek: kur̂- bulbul- dujmin

# وو (دەنگداری درێژ)



مووروو mûrû



خانوو xanû

مێژووناس -پوور- نوور- ئارەزوو

ئارەزوو دوو ڕۆژە چۆتە قوولەر ماڵی پووری.

ئەو میوە دوو هێشووی تری پێوەیە.

ئەو کوڕە پشتی کووڕە.

یەزد دوورو گەز نزیک.

**تێبینی:**

وەک دەبینین دەنگی ئەو واوە لە دەنگی واوی کورت، درێژترە.

# û (dengdarî dirêj)



خانوو xanû



موورو mûrû

mêjûnas- pûr- nûr- arezû

arezû dû r̂oje çote qûler maĺî pûrî.

ew mêwe dû hêşûy tirê pêweye.

ew kur̂e pştî kûr̂e.

yezd dûr u gez nizîk.

## têbînî:

wek debînîn dengî ew wawe le dengî wawî kurt. drêjtire.

# ٩





نۆ no | Top تۆپ | گۆرەوی gorewî

چۆم- خۆم- خۆی- گۆرەوی- گۆم

گۆران جووتێکی گۆرەوی بۆ کڕیم.

خۆی شارێکی خۆشە.

من لە خۆڕا وا ناڵێم.

خزم گۆشتیشت بخوا ئێسکت ناشکێنێ.

تێبینی:

بـۆ ئەو واوە زار زیاتر ئاواڵە دەبێتەوە لە هەڵسـەنگاندن لە بەرابەر واوی کورت و واوی درێژ:.







gorewî گۆرەوی Top تۆپ نۆ no

çom- xom- xoy- gorewî- gom

goran cûtêkî gorewî bo kiřîm.

xoy şarêkî xoşe.

min le xořa wa naÎêm.

xizm goştîşit bixwa êskit naşkênê.

têbînî:

bo ew wawe zar ziyatir awaÎe debêtewe le heÎsengandin le beraber wawî kurt u wawî dirêj.

# حەسەنی سەلاح (سۆران)

حەسەنی سەلاح (سۆران) لە ساڵی (١٣١٩) لە دیی سارو قامیش سەر بە شاری بۆکان لەدایک بووە.
شارەزایی بە سەر زۆر زمان وەک کوردی و فارسی و ئینگلیسی و ئالمانی و ئیتالیایی و فەرانسەویدا هەبوو.
شاعیرو نووسەرو وەرگێڕیکی بە توانابوو تائیستا ئەو کتێبانەی چاپ کراون:
دیوانی سۆران- کانی سارد- باڵە کۆلارە- کەماجار.
مامۆستا سەلاح سوران بەرپرسی بەشی فەرهەنگیی کۆڕی کوردانی دانیشتووی تاران بوو و لە زانکۆکانی سەلاحەددین و سۆران تەدریسی دەکردو بە ئەندامەتی کۆڕی زانیاریی کورد وەرگیرابوو.
مامۆستا لەگەڵێک فستیواڵ و کۆنگرە بەشدارییان کردبوو و خەڵاتیان وەرگرت بوو ڕێزیان لێ گیرابوو. ناوبراو لە ساڵی (١٣٨٨) بە ڕەحمەتی خوا چوو.

# Ĥesenî selaĥ (soran)

ĥesenî selaĥ (soran) le saÎî (1319 )le dêy saru qamîş ser be şarî bokan ledayk bûwe

şarezayî be ser zor ziman wek kurdî w farsîw înglîsîw aÎmanîw îtaÎiyayî w feřansewîda hebû.

şa'îru nûser u wergêrêkî be tuana bû ta êsta ew kitêbaney çap kirawin:

dîwanî soran- kanî sard- baÎe kolare- kemacaŕ.

mamosta selaĥ soran berprsî beşî ferhengîy koŕî kurdanî danîştûy taran bû le zankokanî selaĥeddînu soran tedrîsî dekird be endametî koŕî zanyarîy kurd wergîrabû.

mamosta legelêk fistwaÎ u kongre beşdarîyan kirdbû w xeÎatyan wergirtbû w rêzyan lê gîrabû.

Nawbiraw le saÎî (1388)be řeĥmetî xuwa çû.

# کاک حوسێنی شێربەگی

لـە سـاڵی (١٣٣٥)ی کۆچیـی هەتـاوی لە شـاری بۆکان لـە دایک بـووە. مـاوەی سـی سـاڵ مامۆسـتای قوتابخانەکانـی بـۆکان بـووەو ئێسـتا خانەنشـین کـراوەو لـە شـاری بـۆکان دەژی. کاک حوسێن نووسەرێکی بە توانایەو تائێستا چەند کتێبی بە ناوەکانی: شـاربەدەر (ڕۆمـان)- دۆنـادون (چیـرۆک)- ئاوێنـەی جـادوو- سـەعاتی بیسـت و دوو دەقیقـە بەرەبەیـان (وەرگێـڕدراو)- ئەفسـانەی دووری (وەرگێـڕدراو)- دایـە باوەکتێبم بـۆ بخوێنەوە، چـاپ کـراون. کاک حوسـێن لـە نووسـەرانی بەناوبانگـی کوردە.

# kak Ĥusênî şêrbegî

le saîî (1335)î koçî hetawî le şarî bokan le dayk bûwe. mawey sî saî mamostay qutabxanekanî bokan bûwe. êsta xanenişîn kirawe، le şarî bokan dejî.

kak ĥusên nûserêkî be tuanayew ta êsta çend kitêbî be nawekanî:
şarbeder (řoman)- donadon (çîrok)- awêney cadû-se'atî bîst u dû deqîqe berebeyan (wergêřdiraw)- efsaney dûrî (wergêřdiraw)- daye bawekitêbim bo bixwênewe، çap kirawin. kak ĥusên le nûseranî benawbangî kurde.

# فەوزییە سوڵتانبەگی

یای فەوزییە سوڵتانبەگی لە ساڵی (١٣٥١) لەدێی دووکچی سەر بەشاری بۆکان لە دایک بووە.
فەوزییەخانم شاعیرێکی بە هەستەو بەشێک لە شیعرەکانی بە ناوی ((ئێوارە عاشقەکانی تەمەن)) چاپ کراوە. ناوبراو لە ساڵی (١٣٧٩) لە فستیواڵی گەلاوێژ لە شاری سلیمانی پلەی یەکەمی لە بەشی شیعردا هێناوەتەوەو لە ساڵی (١٣٨٤)یش پلەی سێیەمی چیروکی هەر لەم فستیواڵەدا وەدەست کەوتووە.
فەزوییەخانم ئێستا لە شاری بۆکان دەژی و هاوسەرەکەی کاک ڕەسووڵ (ی) سۆفی سوڵتانیش یەکێک لە شاعیرە باشەکانی کوردە.
ناوبراو لە بواری وەرگێڕانیشدا کاردەکاو شیعرو وتاری لە چەند گۆڤارو ڕۆژنامەدا بڵاوبۆتەوە.

# Fewziye suÎtanbegî

Yay fewziye suÎtanbegî le saÎî (1351) le dêy dûkçî ser be şarî bokan le dayk buwe.

fewziyexanim şa'îrêkî be heste w beşêk le şî'rekanî be nawî ((êware 'aşqekanî temen)) çap kirawe. nawbiraw le saÎî (1379) le fistîwaÎî gelawêj le şarî siliêmanî pley yekemî le beşî şî'rda hênawetewew le saÎî (1384)îş piley sêyemî çîrokî her lem fistîwaÎ eda wedest kewtûwe.

fewziyexanim êsta le şarî bokan dejîw hawserekey kak řesûÎ (î) sofî suÎtanîş yekêk le şa'îre başekanî kurde.

nawbiraw le buwarî wergêřanîşda kardekaw şî'ru witarî le çend govar u řojnameda biÎawbotewe.

# ڕەشید(ی) یاسەمی

مامۆستا غولامڕەزا ڕەشیدی یاسەمی کوڕی محەممەد وەلیخانی میرپەنجی گۆران لە ساڵی (١٢٧٩)ی کۆچی هەتاوی لە شارۆچکەی گەهوارەی سەر بە پارێزگای کرماشان لە دایک بووەو لەڕۆژی چوارشەممە (١٨)ی مانگی گوڵانی (١٣٣٢) لە تاران کۆچی دوایی کردووە.

ڕەشید (ی) یاسەمی لە ساڵی (١٣١٣)ی کۆچیی هەتاوی کرا بە مامۆستای زانکۆ لە زانکۆی تاران.

ڕەشیدی یاسەمی ئەدیب و شاعیرو وەرگێڕو مێژوناسێکی گەورە بوو. ئەو زیاتر لە چل کتێب و نووسراوەی لە پاش بەجێ ماوە. ڕەشیدی یاسەمی لە کوردەکانی ئەهلی حەقە.

# R̂eşîd(î) yasemî

mamosta x̂uÎamr̂eza r̂eşîd(î) yasemî kur̂î mihemmed welîxanî mîrpencî goran le saÎî (1279y) koçî hetawî le şaroçkey gehwarey ser be parêzgay kirmaşan le dayk buwew ler̂ojî çuarşemmey (18)y mangî guÎanî (1332) le taran koçî duayî kirduwe.

r̂eşîdî yasemî le saÎî (1313)y koçî hetawî kira be mamostay zanko le zankoy taran.

r̂eşîdî yasemî edîbu şa'îru wergêr̂ u mêjûnasêkî gewre bû. ew ziyatir le çil kitêb u nûsrawey le paş becê mawe. r̂eşîdî yasemî le kurdekanî ehlî ĥeqe.

# ئەحمەد(ی) قازی

شاعیرو نووسەرو وەرگێڕی کورد ئەحمەدی قازی لە ساڵی (١٣١٥) لە شاری مەهاباد لە دایک بووە.

خوێندنی خۆی تا پلەی لیسانسی زمانی ئینگلیسی درێژەپێداوە. لە ساڵی (١٣٦٥)دا کراوەتە سەر نووسەری گۆڤاری سروەو لە ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی دەس بەکاربووەو خزمەتێکی زۆری بە فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی کردووە. تائێستا ئەو کتێبانەی چاپ کراون:

١-باقەبێن (ڕۆمان).

٢-مشک و پشیلە (وەرگێڕان).

٣-دوانەی سەیرو سەمەرە (وەرگێڕان).

٤-گێلگەمیش (وەرگێڕان).

٥-سەددام و جەنگی خەلیجی فارس (وەرگێڕان لە ئینگلیسیەوە بۆ زمانی فارسی).

# Eĥmed(î) qazî

şa'îr u nûser u wergêřî kurd eĥmedî qazî le saĺî ( 1315) le şarî mehabad le dayk buwe.
xuêndinî xoy ta piley lîsansî zimanî înglîsî dirêjepêdawe le saĺî (1365)da kirawete ser nûserî govarî sirwe w le nawendî biĺawkirdinewey ferheng u edebî kurdî des bekarbûwe w xizmetêkî zorî be ferheng u edebî kurdî kirdûwe. Ta êsta ew kitêbaney çap kirawin:

1- baqebên (řoman).
2- mişk u pişîle (wergêřan).
3- duaney seyr u semere (wergêřan).
4- gêlgemîş (wergêřan).
5- seddam u cengî xelîcî fars (wergêřan le înglîsiyewe bo zimanî farsî).

# لەتیف هەڵمەت

لەتیـف هەڵمــەت شــاعیری بەناوبانگی کـورد لە ســاڵی (١٩٤٩) لە شاری کفری ســەر بە پارێزگای کەرکووک لە دایک بووە. خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی و دواناوەندی لە شاری کفری تەواو کردووە.
لەتیف هەڵمەت لە شیعرو ئەدەبی منداڵانیشدا دەستێکی باڵای هەیەو زۆر کتێبی شـیعرو چیرۆکی منداڵانی لەگەڵ ســێ دیوانی شـیعری چاپ کردووە.
چەند کتێبی شیعرو وتاری چاپ بووە. لە گەلێک گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا شــیعرو وتاری بڵاوبۆتەوە. مامۆســتا لەتیف هەڵمەت هەر ئێستا لە شــارەکانی ســلێمانی و کەرکووک لە دەزگای ڕۆشنبیری گەلاوێژی نوێ کاردەکا.

# Letîf heÎmet

Letîf heÎmet şa'îrî benawbangî kurd le saÎî(1949) le şarî kifrî ser be parêzgay kerkûk le dayk bûwe. xuêndinî seretayî. nawendîw duanawendî le şarî kifrî tewaw kirdûwe.

Letîf heÎmet le şî'ru edebî mindaÎanîşda destêkî baÎ ay heyew zor kitêbî şî'ru çîrokî mindalÎanî legeÎ sê dîwanî şî'rî çap kirdûwe.

çend kitêbî şî'ru witarî çap bûwe. le gelêk govar u řojnamekanda şî'ru witarî biÎaw botewe. mamosta Letîf heÎmet her êsta le şarekanî silêmanî w kerkûk le dezgay řoşinbîrî gelawêjî nuê kardeka.

# چەند خاڵی ڕێنووسی و زمانەوانی

١- ئەو وشـانەی تەشـدیدیان تێدایە لە نووسـیندا پیتی تەشدیددار دووپات دەبێتەوە. وەک: قەسساب- نەججاڕ- ڕەحمەتوڵڵا.

٢- چونکـە ڕێی گـەورە فۆنیمێکی جیاوازە لەڕێـی لاواز، با هەموو ڕێیەکانی یەکەمی وشـەڕێی گەورە بن، نووسینی هێمای (^) لەسەر ڕێی یەکەمی وشەش پێویستە.

٣- لـە زمانـی کوردیدا لـە هێندێک وشـەدا دەنگـداری دوو لایەنە (لێکدراو) (دیفتۆنگ) هەست پێدەکرێ.

لەو وشانەدا دوو دەنگدار بێ ئەوەی پیتێکی بێدەنگیان بکەوێتە نێوان لە تەنیشت یەک دێن.

وەک گوێـز (و+ ێ)- خوێن (و+ ێ)- نێنگوین (و+ ی)- خوار (و+ ا) چوار (و+ ا).

# çend xaĺî r̂ênûsî w zimanewanî

1- ew wişaney teşdîdyan têdaye le nûsînda pîtî teşdîddar dûpat debêtewe. wek: qessab- neccar̂- r̂eĥmetuĺĺa.

2- çunke r̂êy gewre fonîmêkî ciyawaze le r̂êy lawaz, ba hemû r̂êyekanî yekemî wişe r̂êy gewre bin. nûsînî hêmay ( ^ ) leser r̂êy yekemî wişeş pêwîste.

3-le zimanî kurdîda le hêndêk wişeda dengdarî dû layene (lêkdraw) (dîftong) hest pêdekirê.

lew wişaneda dû dengdar bê ewey pîtêkî bêdengyan bikewête nêwan le tenîşt yek dên.

wek guêz (u+ ê)- xuên (u+ ê)- nênguîn (u+ î)- xuar (u+ a) çuar (u+ a).

## چەند نموونە پرسیار بۆ تاقیکاریی خوێندکاران

١- چوار وشە بنووسن پیتی (ا)ی تێدابێ.

٢- لەو ڕستەدا پیتە بێدەنگەکان جودا بکەنەوە:

وا باشە کارەکانمان بە پوختی بکەین.

٣- کافـی کلـۆر چ تایبەتمەندییەکـی هەیـە؟ چـوار وێنە لـەو کافە بێننەوە.

٤- ڕێـی گـەورە چ تایبەتمەندییەکـی هەیـە؟ چـوار وێنە لـەو ڕێیە بێننەوە.

٥- جیاوازیـی نێـوان واوی بێدەنـگ و واوی کـورت چییە؟ بۆ هەر کامەیان دوو وێنە بێننەوە.

٦- جیاوازی نێوان یێی دەنگدارو یێی بێدەنگ بنووسـن و دوو وێنە بۆ هەر کامەیان بێننەوە؟

٧-پیتە دەنگدارەکانی زمانی کوردی بنووسن.

٨-بـو هەمـزە لە نووسـینی کوردی بـە ئەلفوبێی لاتیـن هێمای بۆ دانەندراوە؟

٩-لەنووسینی کوردیدا تەشدید چون نیشان دەدری؟

١٠-پیتە دەنگدارەکانی وشەی ( براکەمان) کامانەن؟

١١-گافی کلۆر چ جۆرە گافێکەچوارجۆری بۆ بێننەوە؟

١٢-چوار وشە بێننەوە کورتە بزوێنیان هەبێت؟

# çend nimûne pirsiyar bo taqîkarî xuêndkaran

1- çuar wişe binûsin pîtî (a)y têdabê.

2- lew řisteda pîte bêdengekan cuda bikenewe: Wa başe karekanman be puxtî bikeyn.

3- Kafî kilor ç taybetmendiyekî heye? çuar wêne lew kafe bêninewe.

4- řêy gewre ç taybetmendiyekî heye? çuar wêne lew řêye bênnewe.

5- ciyawazî nêwan wawî bêdengu wawî kurt çiye? bo her kameyan dû wêne bênnewe.

6- ciyawazî nêwan yêy dengdaru yêy bêdeng binûsinu. dû wêne bo her kameyan bênnewe?

7- pîte dengdarekanî zimanî kurdî binûsin.

8- bo hemze le nûsînî kurdî be elfubêy latîn hêmay bo danendirawe?

9-lenûsînî kurdîda teşdîd çon nîşan dedrê?

10- pîte dengdarekanî wişey ( birakeman) kamanen?

11-Gafî kilor çi core Gafêke? çuar corî bo bênnewe?

12- çuar wişe bênnewe kurte bizwênyan hebê?

# غەزەلێک لە ئەدەب

ئەگەر تووبایە وەک تۆ جەننەت ئارا
لە سایەی قامەتی تۆیە نیگارا
چ سیحریکە بەدوو زولفی چەلیپات
کە مەقبوولە بە ئیسلام و نەسارا
لەدڵدا ئاتەشێکی عالەم ئەفرووز
لەدیدە گوڵشەنێکی عالەم ئارا
هەتا دوورم ئەڵێم ئەتگرمە باوەش
کە دێمە ڕووبەڕووی تۆ نیمە یارا
بەدیدارت ئەگەر تارێ لە زولفت
بە ملکی کەی بدەم یا تەختی دارا
بە خوێنی من ئەگەر سەرخۆش ئەبی تۆ
وەکوو جامی سەبووحیت بێ گەوارا
لە جەوری تۆ دڵم نەشکاوە قەت من
عەجەب لەو شیشەیە نەشکا بە خارا
دەڵێم جانا مودارایەک بفەرموو
لەگەڵ عاشق ئەگەر بووبێ مودارا
((ئەدەب)) بەو غایەتەی تۆ پاییەندی
بە فەریادت بگا شاهی بوخارا

# X̂ezelêk le edeb

eger tûbaye wek to cennet ara
le sayey qametî toye nîgara
ç sîĥrêke be dû zulfî çelîpat
ke meqbûl̂e be îslam u nesara
lediîda ateşêkî 'alem efrûz
ledîde gul̂şenêkî 'alem ara
heta dûrim el̂êm etgirme baweş
ke dême r̂ûber̂ûy to nîme yara
bedîdart eger tarê le zulfit
be mil̂kî key bidem ya textî dara
be xuênî min eger serxoş ebî to
wekû camî sebûĥ ît bê gewara
le cewrî to dil̂im neşkawe qet min
'eceb lew şîşeye neşka be xara
del̂êm cana mudarayek bifermû
legel̂ 'aşiq eger bûbê mudara
((edeb)) bew x̂ayetey to paybendî
be feryadit biga şahî buxara

## غەزەلێک لە گۆران

لە بەختی تاری شەو ناکەم شکایەت
شەبیهە چونکە بەو زولفی سیایەت
نییە قابیل برینی ڕاهی دووری
وەکوو پرچت کشاوە بێنیهایەت!
بە هیچ خاکستەرێ ناکەم نەکا بۆم
لە ئەنجامی لە هیبی حوب حیکایەت!
کە تیری نیونیگات چەرخانە ئینسان
قەفەس خاڵی ئەکا مورغی دیرایەت!
لە چاوی بەد، خوا عومری جەوانی
قوبووڵ کالێم بە پاداشتی ویقایەت!
خەوی منداڵ و سەهری عاشقی زار
ئەبەخشێ حوزنی نەغمەی لایە لایەت!
هووەیدایە لەڕەنگی ئاڵی دەستت
کە دائیم پیشەتە قەتڵ و جینایەت!
هەتاکەی، بادەنۆشی عەشقی تۆبم
هەتاکەی، بێمەزەی ماچی کیفایەت؟
دەخیلت بم هومای زولفەینی دڵبەر
بەسەر سەرما بکێشە فەیزی سایەت!
بە گۆران ناکرێ قەت تەرکی سەودا
کلا نابم لەسەر جادەی هیدایەت!

# X̂ezelêk le Goran

le bextî tarî şew nakem şikayet
şebîhe çunke bew zulfî siyayet
niye qabîl birînî r̂ahî dûrî
wekû pirçit kişawe bênîhayet
be hîç xakisterê nakem neka bom
le encamî lehîbî ĥub ĥîkayet!
ke tîrî nîwnîgat çerxane însan
qefes xaÎî eka murx̂î dîrayet!
le çawî bed, xua 'umrî cewanî
qubûÎ ka lêm be padaştî wîqayet!
xewî mindaÎ u sehrî 'aşqî zar
ebexşê ĥuznî nex̂mey laye layet!
huweydaye le r̂engî aÎî destit
ke dayim pîşete qetÎu cînayet!
hetakey, badenoşî 'eşqî tobim
hetakey, bêmezey maçî kîfayet?
dexîlit bim humay zulfeynî diÎber
beser serma bikêşe feyzî sayet!
be goran nakirê qet terkî sewda
kila nabim leser cadey hîdayet!

# غەزەلێک لە قانع

چاوەکەم مەغرووری هەروا یان خەتای نازارییە
نازە، وا ئاڵۆزە چاوت؟ یا لەسەر خوونخوارییە؟
خەم لەمن دێوانەتر بوو شۆڕشی دڵمی کەدی
دەردی دڵ دەردێ گران و عیللەتێکی سارییە
ئاوڕی شان و بەرۆکی خۆم ئەدەم شەیدا ئەبم
چون بە ئەشکی خوێنی جەرگم قرمزو گوڵنارییە
ناتوانێ پێ لە ئەشکی خۆی بنێ تێپەڕ بکا
مەشرەبی عاشق لەسەر ڕەسم و مەقامی هارییە
من بە شوێن دڵما گەڕام، شوێنی بە خوێن دۆزیمەوە
چۆن لە ڕاوچی گوم ئەبێ سەیدێ کە خوێنی جارییە
قانعی بۆیە لە هیجرا خەو لە چاوی ناکەوێ
قاعیدەی حەس حەس وەهایە کەوتە شەوبێدارییە

# X̂ezelêk le qani'

çawekem meX̂rûrî herwa yan xetay nazarîye
naze. wa aL̂oze çawit? ya leser xûnxuariye?
xem lemin dêwanetir bû şoȓişî diL̂mî ke dî
derdî diL̂ derdê giran u 'îlletêkî sariye
awȓî şan u berokî xom edem şeyda ebim
çun be eşkî xuênî cergim qirmiz u guL̂nariye
natuanê pê le eşkî xoy binê têpeȓ bika
meşrebî 'aşiq leser ȓesm u meqamî hariye
min be şwên diL̂ma geȓam. şwênî be xuên dozîmewe
çon le ȓawçî gum ebê seydê ke xuênî cariye
qani'î boye le hîcra xew le çawî nakewê
qa'îdey Ĥesĥes wehaye kewte şewbêdariye

# غەزەلێک لە نالی

عەزیزم، ڕۆحی شیرینم، دووچاوم!
دەوای زامی دڵ و جەرگی بڕاوم!
ئەتۆ شا، من گەدا، دادم بپرسە
لە زوڵمی چاوی بیمارت کوژاوم
ئەگەر نەیدەیتە دەس خۆم قاتیلی خۆم
لەڕۆژی ئاخیرەتدا بێ پێناوم
دەسا لادە سەری زوڵفت لەسەر ڕووت
کە ڕووتی ڕووتم و مایل بە تاوم
لە باتیی خوێنی خۆم ڕازیم بە ماچێ
دەسا بیدە هەتا زیندووم و ماوم
ئەوا نیشانەیی مەرگم عەیانە
کەمن غەرقی خەم و خوێن و زووخاوم
مەکەن مەنعم لە شیوەن ئەی ڕەفیقان
کە مەحزوون و غەمین و دڵ شکاوم
لە ژینی خۆم ئومێدم قەتعەنالی
کە سووتاوە هەموو جەرگ و هەناوم

# X̂ezelêk le nalî

'ezîzim، r̂oĥî şîrînim، dûçawim!
deway zamî diĺ u cergî bir̂awim!
eto şa، min geda، dadim biprse
le zuĺmî çawî bîmarit kujawim
eger neydeyte des xom qatîlî xom
le r̂ojî axîretda bê pênawim
desa lade serî zuĺfit leser r̂ût
ke r̂ûtî r̂ûtmu mayil be tawim
le batî xuênî xom r̂azîm be maçê
desa bîde heta zîndûm u mawim
ewa nîşaneyî mergim 'eyane
kemin x̂erqî xem u xuên u zûxawim
meken men'im le şîwen ey r̂efîqan
ke meĥzûn u xemîn u diĺ şikawim
le jînî xom ûmêdim qet'e nalî
ke sûtawe hemû cerg u henawim

# غەزەلێک لە ئاوات

بەیادی شەمعی ڕوخسارێکی دڵ ئیحیا نەکەم چبکەم
بە شەوقێکی وەهاچاری شەوی یەڵدا نەکەم چبکەم
وەکوو مەجنوونی ماڵ کاول دەرودەشت بۆتە مەئوای من
لە حەیفی عاقڵان خۆم شێتی ڕووی لەیلا نەکەم چبکەم
لە کۆڕی عیشقبازاندا نەماوە قەدری ڕووح و سەر
وەکوو پەروانە بۆ ڕووی ئەو بەڕووح سەودانەکەم چبکەم
دەڵێن یار خاکی بەرپێی سورمەیە بۆ چاومی دێنم
بە کوێرایی ڕەقیبی لامەزەب ئەی وا نەکەم چبکەم
بە شەرتێ بێتەلام شەرتە سەرم دانێم لە پێناوی
ئەگەر بۆ گاوگەردوون ڕووح و سەر ژێرپا نەکەم چبکەم
لە دووری وی گەدام و دێتە لام وەک شا دەبینم خۆم
لە چوون و هاتنی خۆم وەک گەدا،وەک شا نەکەم چبکەم
ئەگەر بابۆنی تۆ بێنێ ((ئیمامی)) وا دەڵێ گیانە
کە من ڕووح و سەرم قوربانی ڕێگەی با نەکەم چبکەم

# X̂ezelêk le Awat

beyadî şem'î r̂uxsarêkî diÎ îĥya nekem çibkem
be şewqêkî wehaçarî şewî yeÎda nekem çibkem
wekû mecnûnî maÎ kawil derudeşt bote meiway
min
le ĥeyfî 'aqÎan xom şêtî r̂ûy leyla nekem çibkem
le kor̂î 'îşqbazanda nemawe qedrî r̂ûĥu ser
wekû perwane bo r̂ûy ew ber̂ûĥ sewdanekem
çîbkem
deÎên yar xakî berpêy surmeye bo çawimî dênim
be kuêrayî r̂eqîbî lamezeb ey wa nekem çibkem
be şertê bêtelam şerte serim danêm le pênawî
eger bo gaugerdûn r̂ûĥ u ser jêr pa nekem çibkem
le dûrî wî gedam u dête lam wek şa debînim xom
le çûn u hatinî xom wek geda.wek şa nekem
çibkem
eger ba bonî to bênê ((îmamî)) wa deÎê giyane
ke min r̂uĥ u serim qurbanî r̂êgey ba nekem
çibikem

# غەزەلێک لە هەژار

چارەڕەش بووم و لەڕێی خاڵی ڕەشا بێچارە مام
دەک چ گیان سەختم کە من تائێستە هەر لەو بارە مام
من لەگەڵ مەجنوونی هاوڕێ بووم لەڕێی شێتی وئەوین
ئەو گەیی بە نیازو من هەر بێ دڵ و ئاوارە مام
بۆ هورووژمم کەوتە کار شیری برۆو تیری مژۆل
کون کونی دڵ دوور لە هەژمارو جەرگ سەد پارە مام
گوڵ بەدەن ئەمڕۆ لە گوڵزاراگوڵی پشکووتبوو
گوڵ دەپشکووتن لەدەم، سەرسامی ئەو گوڵزارە مام
بولبولی لە دیاری گوڵ دڕکی لە قاچی ڕادەچوو
من بەدڵما چوو لە سەیری ئەو گوڵی بێخارە مام
شەوڕەشی پرچت دڵی سارامی وا دێوانە کرد
هەر لە منداڵیمەوە بەو تارەوە پەتیارە مام
پێم دەڵێ ڕەنگ زەردی وەک لیمۆی هەژاری، من وتم
ڕەنگ نەماوی ئەو نەمامە بەژنی لیمۆ دارەمام

# X̂ezelêk le Hejar

çareȓeş bûm u leȓêy xal̂î ȓeşa bêçare mam
dek çi giyan sextim ke min ta êste her lew bare mam
min legel̂ mecnûn ê hawȓê bûm leȓêy şêtî u ewîn
ew geyî be niyaz u min her bê dil̂ u aware mam
bo hurûjmim kewte kar şîrî biro w tîrî mijol̂
kun kunî dil̂ dûr le hejmar u cerig sed pare mam
gul̂ beden emȓo le gul̂zara gul̂î pişkûtbû
gul̂ depişkûtin ledem، sersamî ew gul̂zare mam
bulbulê le diyarî gul̂ diȓkî le qaç î ȓadeçû
min bedil̂ma çû le seyrî ew gul̂î bêxare mam
şewȓeşî pirçit dil̂î saramî wa dêwane kird
her le mindal̂îmewe bew tarewe petyare mam
pêm del̂ê ȓeng zerdî wek lîmoy hejarî، min witim
ȓeng nemawî ew nemame bejnî lîmo daremam

# غەزەلێک لە هێمن

سۆفی گۆشەی خانەقا بووم، ئێستە پیری مەیکەدەم
زاهیدی خەلوەتنشین بووم، ئێستە مەست و مەیزەدەم
سەروی ئازادیش لەبارو دلکەش و بەرزە بەلام
گیانەکەم! من شێت و شەیدای لارو لەنجەی ئەو قەدەم
جیلوەیی جوانی لە هەرچیدا هەبێ خۆشم دەوێ
ڕۆژێ کوشتەی مینی ژۆپ  و ڕۆژێ گیرۆدەی شەدەم
هەر یەکەی بۆ خۆی دەجوولێنێتەوە هەستی دەروون
زەردەپەڕ، کاروانکوژە، تاریک و ڕوونی سوبحدەم
ئاسمانی ساو و دەریای مەند وتارمایی چیا
سێوی لاسوورو بەهێی زەردو هەناری گوڵ بەدەم
کێ وەکوو من ساردو گەرمی ڕۆژگاری چێشتووە؟
گا لەدەشتی گەرمەسێرو گا لە کوێستانی گەدەم!
وەک شەپۆلی زێی خوڕم، ساتێ هەدادانم نییە
گێژ دەخۆم، پێچێ دەدەم، من ڕۆڵە کوردی ئەو سەدەم
ڕێگە سەخت و پڕ لە کەندو لەندو هەڵدێرو گەوە
هەر دەبێ ببزووم، دەبێ بکشێم وچانێ لێنەدەم
سێبەرێ مەرگم لە پێشدایەو بەرەو مەنزڵ دەڕۆم
ناخی گۆڕی تەنگە جێگام، هەر تل  ئاسا بێ قەدەم
من بەرەوئاسۆ، بەرەو ڕووناکی باڵم گرتووە

چۆن بەرەو تاریکی دەخشێم، پاڵ وەشەیتانی دەدەم!
کانی ڕوونم دی بە لێشاوی بەهار شلوێ نەبوو
بەفری گەورەم دی چیای گرت و بە تاوێ بوو قەدەم
ژینی کورتم دی پڕاوپڕ بوو لە شانازی و شەڕەف
عومری زۆرم دی کە دوایی هات بەڕیسوایی و نەدەم
ئاگری سینەم بڵێسەی دێ و وڵات ڕۆشن دەکا
ئەو دەمەی خۆم وەک دڵۆپێک دەچمە نێو دەریای عەدەم

# X̂ezelêk le hêmin

sofî goşey xaneqa bûm. êste pîrî meykedem
zahîdî xeÎwetnişîn bûm. êste mest u meyzedem
serwî azadîş lebar u diÎkeş u berze beÎam
giyanekem! min şêt u şeyday laru lencey ew qedem
cîlweyî cuanî le herçîda hebê xoşim dewê
r̂ojê kuştey mînî jop u r̂ojê gîrodey şedem
her yekey bo xoy decûÎênêtewe hestî derûn
zerdeper̂. karwankuje. tarîk u r̂ûnî subĥdem
asman î saw u deryay mend u tarmayî çiya
sêwî lasûr u behêy zerd u henar î guÎbedem
kê wekû min sard u germî r̂ojgarî çêştûwe?
ga ledeştî germesêr u ga le kuêstanî gedem!
wek şepolî zêy xur̂im. satê hedadanim niye
gêj dexom. pêçê dedem. min r̂oÎe kurdî ew sedem
rêge sextu pir̂ le kendu lendu heÎdêru gewe
her debê bibzûm. debê bikşêm wiçanî lênedem
sêberî mergim le pêşdayew berew menziÎ der̂om
naxî gor̂î tenge cêgam. her tilasa bê qedem

min berewaso، berew r̂ûnakî baļîm girtûwe
çon berew tar̂îkî dexşêm، paļ weşeytanê dedem!
kanî r̂ûnim dî be lêşaw î behar şilwê nebû
befrî gewrem dî çiyay girt u be tawê bû qedem
jînî kurtim dî pîr̂awpîr̂ bû le şanazî w şer̂ef
'umrî zorim dî ke duayî hat ber̂îswayî w nedem
agrî sînem biļêsey dêw wiļat r̂oşin deka
ew demey xom wek diļopêk deçme nêw deryay 'edem

# غەزەلێک لە هێدی

ڕازی من ون ناکرێ تازە هەتا دیدەم هەیە
کار لە حاشا دەرچووە دیدە ئەوەندەی نەم هەیە
ئای لە دەس دیدەو دڵی خۆم چم بەسەر هات ئەی چلۆن
یان لەتای ئەودا دەلەرزم یان مچوڕکی ئەم هەیە
شێت هەیە ئاگای لە کاری خۆشەویستی هەر نییە
ئەو بەدێوانەم دەزانێ من پەژارەی وەم هەیە
ماڵی ئاوابێ ئەوین چیرۆکی هێند لێکەوتەوە
وەک بزانم وردە ڕازێکیان وەکوو هاودەم هەیە
بادە نین واژەی من و تینووی ئەوین وا مەست دەکەن
هەر دەڵێی پەیمانە پەیوەندی لەگەڵ بەستەم هەیە
من خەمی خاڵێک دەخۆم، تەنیا ئەوەندە و هیچی تر
لەو جیهانە گەورەدا هەر ئەو خەمە وردەم هەیە
چاوەڕێ بووم چەند بە چەند بۆ دیتنی ئەمما نەبوو
ئەو نەهات، یان هەر لەبەر چاوی من ئەوڕۆ تەم هەیە
شیعرو بادە مەستی دێنن وەک یەک، ئەمما سەیرە پێم
بۆ لەسەر خۆشیی شیعردا هێندێ ڕەنگی خەم هەیە!
بێوەفاییم گەرچی لێ دیوە بەلام بەو حاڵەوە
هێشتە هەر بۆ نازی وی کڕیاری وەک من کەم هەیە
((هێدی)) بەڵگەی زۆرە بۆ هاواروشینی نیوەشەو
گەرپەڕی پەروانە سووتا، شاهیدی وەک شەم هەیە

# X̂ezelêk le hêdî

r̂azî min win nakirê  taze heta dîdem heye
kar le ĥaşa derçûwe dîde ewendey nem heye
ay le des dîdew dil̂î xom çim beser hat ey çilon
yan letay ewda delerzim yan miçur̂kî em heye
şêt heye agay le kar̂î xoşewîstî her niye
ew bedêwanem dezanê min pejarey wem heye
mal̂î awabê ewîn çîrokî hênd lê kewtewe
wek bizanim wirde r̂azêkyan wekû hawdem heye
bade nîn wajey min u tînuy ewîn wa mest deken
her del̂êy peymane peywendî legel̂ bestem heye
min xemî xal̂êk dexom، tenya ewende w hîçî tir
lew cîhane gewreda her ew xeme wirdem heye
çawer̂êy bûm çend be çend bo dîtinî emma nebû
ew nehat، yan her leber çawî min ewr̂o tem heye
şî'r u bade mestî dênin wek yek، emma seyre pêm
bo leser xoş î şî'rda hêndê  r̂engî xem heye!
bêwefayîm gerç î lê dîwe bel̂am bew  ĥal̂ewe
hêşte her bo nazî w î kir̂iyar̂î wek min kem heye
((hêdî)) bel̂gey zore bo hawar u şînî nîweşew
gern per̂î perwane sûta، şahîdî wek şem heye

# غەزەلێک لە ڕاوچی (مەلا کەریم عەزیز نەژاد)

گوڵم! تەیری تەلانی بێ بژیوی
لە دەس داڵی خەیاڵی دژ ڕەویوی
لە پارێزی گزەی شیعرم، دەترسی؟
کەوا تێمیسکە سەر لێوی گەزیوی؟
کچی کوردی هەرێمی، یا فریشتەیێ
لە نێو عەرشی خوداییدا، فڕیوی؟
تکەی ئیلهامی ئاونگی ئەوینی
لەسەر پەلکی گوڵی شیعرم وەریوی؟
بەڕەش گیراوە ڕۆژی ڕوونی بەختم
کەوا چار شێوی ڕەش دەوری تەنیوی
بە هەڵوێستی شل و شەرمن دیاری
پەپوولەی باخە کوردێکی هەتیوی
لە مێژە دڵ بە دووتا دێ دەزانم
لە نێو هەستێکی ناسک دابەزیوی
هەلەو دەستم لە ئەستۆکە، هەتاکەی
لەنێو تەبعی تەڕی ((ڕاوچی)) خزیوی

•

# X̂ezelêk le r̂awçî (mela kerîm 'ezîz nejad)

gul̂im! teyrî telanî bê bijêwî
le des dal̂î xeyal̂î dij r̂ewîwî
le parêzî gizey şî'rim، detirsî?
kewa têmîske ser lêwî gezîwî?
kiçî kurdî herêmî، ya firîştey
le nêw 'er̂şî xudayîda، fir̂îw î?
tikey îlhamî awingî ewînî
leser pelkî gul̂î şî'rim werîwî?
ber̂eş gîrawe r̂ojî r̂ûnî bextim
kewa çar şêwî r̂eş dewrî tenîwî
be hel̂wêstî şil u şermin diyarî
pepûley bax̂e kurdêkî hetîw î
le mêje dil̂ be dûta dê dezanim
le nêw hestêkî nasik dabezîwî
hele w destm le estoke، hetakey
lenêw teb'î ter̂î ((r̂awçî)) xizîwî

## غەزەلێک لە مستەفا ئێلخانی زادە

ئەوە شەرتێکە کردوومە هەتا مان
هەتا مێشک و لەشم هەن تەحتی فەرمان
لەدڵ قەت دەرنەکەم عیشقی غەزالم
کە هەر عیشق و ئومێدن ڕەمزی هەرمان
کە باسی خۆشەویستیم کرد لەلای ئەو
عەزیزی من سەری داخست لە شەرمان
زەکاتی جوانی خۆتم پێ کەرەم کە
هەر ئێستام لازمە نەک وەعدی خەرمان
تەبیبا من نەخۆشی دەردی عیشقم
بە تەشخیست مەدە تۆ دەردی سەرمان
لە نوسخەتدابنووسە ماچی لێوی
لە جیاتی شەربەت و ئامپوول و دەرمان
دەوا نابێ برینم جوز بە وەسڵی
لە کوێ چارەم دەکا جارجارە سەردان

# X̂ezelêk le Mistefa êlxanî Zade

ewe şertêke kirdûme heta man
heta mêşku leşim hen teĥtî ferman
ledil̂ qet dernekem 'îşqî  x̂ezalim
ke her 'îşqu umêdin r̂emzî herman
ke basî xoşewîstîm kird lelay ew
'ezîzî min serî daxist le şerman
zekatî cuanî xotim pê kerem ke
her êstam lazime nek we'dî xerman
tebîba min nexoşî derdî 'îşqim
be teşxîst mede to derdîserman
le nusxetda binûse maçî lêwî
le ciyatî şerbet u ampûlu derman
dewa nabê birînim cuz be wesl̂î
le kuê çarem deka carcare serdan

# غەزەلێک لە کەریمی دافیعی (ک. د. ئازاد)

((با بناڵن عاشقان تێکڕا بە کوڵ
حەیفە با ئەو شیوەنە نەبڕێتەوە))
موژدە بێ بۆ عاشقانی چاوەڕێ
یاری شیرین دێتەوە هەر دێتەوە
فەسڵی جستان کۆچ ئەکا، هەردێ بەهار
دەردو ئازار لاوەکان دەبڕێتەوە
کێ دەڵێ بولبول کەمرد گوڵ هەڵوەری
دەستی خەم عەشق ووەفا دەسڕێتەوە؟
کوانێ داوێن پیس پلەی عەشقی هەیە
پاک بە سروەی یەک نیگا دەشنێتەوە
کێ دەبێتە باعیسی دوودڵ، ئەبەد
ئاسەواری دەک ڕەبی پابێتەوە
عاشقی پاکە ئەوەی بۆ یەک نیگا
سوژدە با، دابێتەوە، بشکێتەوە
مەنعی شینی من مەکەن، هەر سەیرەگەر
خەم لە ((ئازاد)) ساعەتێ جیا بێتەوە!

## Xezelêk le kerîmî dafî'î (k. d. azad)

((ba binaîin 'aşiqan têkra be kuî
heyfe ba ew şîwene nebrêtewe))
mujde bê bo 'aşqanî çawerê
yarî şîrîn dêtewe her dêtewe
fesîî cistan koç eka، herdê behar
derd u azar lawekan debrêtewe
kê deîê bulbul kemird guî heîwerî
destî xem 'eşq u wefa desrêtewe?
kuanê dawên pîs piley 'eşqî heye
pak be sirwey yek nîga deşnêtewe
kê debête ba'îsî dûdiî، ebed
asewarî dekrebî pabêtewe
'aşqî pake ewey bo yek nîga
sujde ba، dabêtewe، bişkêtewe
men'î şînî min meken، her seyreger
xem le ((azad)) sa'etê ciya bêtewe!